# زیرەکی دەستکرد




نووسینی

سۆزیار عوسمان



بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ وَلَا تَعْجَلْ بِالْقُرْآنِ مِن قَبْلِ أَن يُقْضَىٰ إِلَيْكَ وَحْيُهُ وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا ﴿١١٤﴾

**ناوی کتێب: زیرەکی دەستکرد**

**ئامادەکردنی:سۆزیار عوسمان**

**خوێندکاری زانستی کۆمپیتەر**

**دیزاینی بەرگ و ناوەوە:شۆخ حەیدەر**

## { سەرەتا بەناوی خودای بەخشندە و میهرەبان }

## پێشەکی:

لەم کتێبەدا باسێکی بابەتێکی دیکەی زانستی کۆمپیتەر دەکەم هەولدەدەم بە شێوەیەکی کورت و پوخت باسی زیرەکی دەستکر بکەم بۆ خوێنەرانی ئازیز.

ئەم کتێبە سوودی دەبێت بۆ ئەو خوێندکارانەی لە زانستی کۆمپتەر و بەشە کانی ئایتی و سۆفتوەیر .........هتد دەخوێنن ، و سوودی دەبێت بۆ ئەو خوێنەرانەی کە حەزیان بە بوونی زانیاری دەربارەی بەرەو پێشچوونی تەکنەلۆژیا و زیرەکی دەستکرد هەیە.

هەولدەدەم بە شێوەیەکی ڕوون باسی بابەتەکە بکەم و خوێنەر بەئاسانی بتوانێت پێش چاورونی هەبێت بۆ بابەتەکە و ئالۆز نەبێت بۆی بوونی ئەم بابەتە زانستیانە و باسکردنی لە کتێبدا بە شێوەیەکی زۆر کەمە هۆکارەکەشی دەگەرێتەوە بۆ کەمی خوێنەر و گرنگی دانی کەم بە بابەتە زانستیەکان زۆرینەی ئەو کەسانەی سوود لەم جۆرە بابەتانە دەبینن و هەولدەدەن زانیاریان هەبێت

دەربارەی ئەم بابەتانە  خوێنکارانی زانکۆ و پەیمانگاکانن بەلام من هیوادارم زۆرترین کەس و زۆرترین خوێنەر سوود لەم بابەتە ببینێت.

## چی وای کرد باسی زیرەکی دەستکرد بکەم ؟

وەک دەزانین لە سەردەمی ئێستادا تەکنەلۆژیا لە کوردستا ن و جیهاندا  بە شێوەیەکی بەرچاو گەشەی سەندوە بە جۆرێک کە تەکنەلۆژیا جیهان داگیر دەکات .

هەمووان لە ئەمرۆدا بەکارهێنەری تەکنەلۆژیاین بێ گومان زۆری بەکارهێنەرەوایکردوە بەم جۆرەی ئێستا تەکنەلۆژیا فراوان ببێت و لە گەشەی بەردەوامدابێت ،بەگرنگم زانی باسی ئەم بابەتە( زیرەکی دەستکرد) بکەم چونکە بەشێکی زۆر  گرنگە لە تەکنەلۆژیا.

## هەندێک لەوبابەتەسەرەکیانەی لە کتێبەکەداباسمان کردووە:

- زیرەکی دەستکرد یان ژیری دەستکرد چییە؟
- سەرەتای سەرهەڵدان یان مێژووی زیرەکی دەستکر چۆنە؟
- ئەلان مێسۆن تورینگ کێیە؟
- شێوازی تاقیکردنەوەکەی تورینگ چۆن بوو؟
- ژیری گشتی چییە؟
- ژیری هزری قوڵ چییە ؟
- زیرەکی دەستکرد چۆن جیاوازە لە زیرەکی مرۆڤ؟
- زیرەکی دەستکرد چۆن کار دەکات؟

**جیاوازی نێوان Artificial intelligence و Machine Learning**

**و Deep learning چیە؟**

- **OpenAIچییە؟**
- **زیرەکی دەستکرد لە چ بوارێکدا بەکار دێت ؟**
- **زیرەکی دەستکرد لە بواری پزیشکیدا.**
- **زیرەکی دەستکرد لە بواری پەروەردەدا.**
- **زیرەکی دەستکرد لە بواری سەربازیدا.**

- **باسکردنی چاتبۆتەکان و دەنگبۆتەکان و  رۆبۆتەکان.**

- **سوود وزیانی هەندێک لە چاتبۆتەکان و رۆبۆتەکان.**

- **سودەکانی زیرەکی دەستکرد.**

- **مەترسییەکانی زیرەکی دەستکرد.**

- **زیانەکانی زیرەکی دەستکرد.**

## باسێکی کورت.........

ئەگەر تۆ خوێنەری بابەتی تەکنەلۆژی بیت، یان هەندێک بابەتی پێشکەوتنی دونیای تەکنەلۆژیا بیت، بێگومان گوێبیستی شتێک بوویت بە ناوی ژیری دەستکرد یاخوود بە ئینگلیزی'Artificial intelligence' ، پرسیار دەکەیت ئەم تەکنەلۆژیایە چییە و چۆن کار دەکات؟ ئێستا وەڵامەکەی وەر بگرە!

ژیری دەستکرد پێشکەوتنێکی تەکنەلۆژییە بە بەکارهێنانی زمانەکانی پرۆگرام بۆ چارەسەر کردنی کێشەکان، بەڵام ئایا کێشە درووست دەکەن لە داهاتوودا یان کێشە چارەسەر دەکەن؟



سەرەتا با پێناسەیەک بۆ ژیری دەستکرد بکەین:

## زیرەکی دەستکرد یان ژیری دەستکرد چییە؟

ژیریی دەستکرد (بە ئینگلیزیArtificial intelligence ، بە عەرەبی: الذكاء الاصطناعي) کورتکراوە (ئەی ئای، AI بریتییە لە زیرەکی یاخوود درکپێکردن کە لەلایەن ئامێرە ئەلیکترۆنییەکانەوە نیشاندەدرێت،

زیرەکی دەستکرد لقێکی فراوانی زانستی کۆمپیوتەرە کە بە خەمی بنیاتنانی ئامێری زیرەکەوەیە کە توانای ئەنجامدانی ئەرکەکان هەیە کە بە شێوەیەکی ئاسایی پێویستی بە زیرەکی مرۆڤ هەیە .

یان دەتوانین بلێین ژیری دەستکرد بریتییە لە تیۆری و پەرەپێدانی پرۆگرامەکانی کۆمپیوتەر کە توانای هەبێت چارەسەری کێشەکان بکات و هەندێک ئەرک ئەنجام بدات کە پێویستی بە زیرەکی مرۆڤە، بۆ نموونە تێگەشتن لە کەسی بەرامبەر، ئەنجامدانی گفتوگۆ، و زیاتریش، واتە بە کورتی هەموو ئەو شتانەی کە پێویستی بە مرۆڤێک و ژیرییەکەی هەیە بۆ ئەوەی

ئەنجامی بدات، ژیری دەستکرد بریتییە لەوەی ئەو ئەرکانە لە ڕێگەی پرۆگرام کردن بە ئامێرێکی دیکە ئەنجام بدرێت.

## سەرەتای سەرهەلدان یان مێژووی زیرەکی دەستکر چۆنە؟

کە باس لە مێژوی زیرەکی دەستکرد دەکرێت هەموان خەیالیان بۆ لای ئەلان تورینگ دەروات. ئەلان مێسۆن تورینگ، پێشەنگ لە زانستی کۆمپیوتەر و کریپتۆگرافی. ئەم بیرکاریزان و لۆژیکزانە بەریتانییە بە باوکی زانستی کۆمپیوتەر دادەنرێن.

ئەلان تورینگ پۆلیسێکی گەنجی بەریتانی بوو کە توانای بیرکاری زیرەکی دەستکردی دۆزییەوە. تورینگ پێشنیاری ئەوەی کرد کە مرۆڤ زانیاری بەردەست و هەروەها بەکاردەهێنێت بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان و بڕیاردان، کەواتە بۆچی ئامێرەکان ناتوانن هەمان شت بکەن؟ ئەمە چوارچێوەی لۆژیکی توێژینەوەکەی ساڵی ١٩٥٠ بوو بە ناوی ئامێری کۆمپیوتەر و زیرەکی کە تیایدا باسی چۆنیەتی دروستکردنی ئامێری زیرەک و چۆنیەتی تاقیکردنەوەی زیرەکییان دەکرد.

## تاقیکردنەوەکەی تورینگ ......

تاقیکردنەوەی تورینگ توانای ئامێرێکانی بۆ نیشاندانی زیرەکی مرۆڤ دەردەخست . بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٥٠ لەلایەن بیرکاریزان و زانای کۆمپیوتەری بەریتانی ئەلان تورینگ پێشنیار کرا.



## شێوازی تاقیکردنەوەکەی تورینگ سادەیە و بەم جۆرە بوو :

مرۆڤێک بەشدار دەبێت دەتوانین ناوی بنێین دادوەر لە گفتوگۆیەکی لەسەر بنەمای دەق لەگەڵ مرۆڤکی تر و ئامێرێک، و دواتر بڕیار دەدات کام لەو دووانە مرۆڤن . ئەگەر دادوەر نەتوانێت جیاوازی بکات لە نێوان مرۆڤ و ئامێرەکە لەسەر بنەمای گفتوگۆکە، ئەوا ئامێرەکە لە تاقیکردنەوەی تورینگ تێپەڕیوە.




تاقیکردنەوەی تورینگ بە شێوەیەکی بەرفراوان بەکاردێت وەک پێوەرێک بۆ هەڵسەنگاندنی پێشکەوتنی توێژینەوەی زیرەکی دەستکرد، و ئیلهامبەخش بووە بۆ چەندین لێکۆڵینەوە و تاقیکردنەوە بە ئامانجی پەرەپێدانی ئامێرەکان کە دەتوانن لە تاقیکردنەوەکە تێبپەڕن.

## به شێوەیەکی گشتی کەی ئەم جۆرە تەکنەلۆژیایە پەیدابوو؟

بەڵام دەتوانین بە شێوەیەکی گشتی بڵێین ئەم جۆرە تەکنەلۆژیایە لە مانگی حوزەیرانی ساڵی 1965 دەرکەوت بۆ یەکەمین جار، لەسەر دەستی کۆمەڵێک زانای تەکنەلۆژی و بیرکاری ئەو سەردەمە، کۆبوونەوە لەسەر بیرۆکەیەک، بیرۆکەکە بریتی بوو لەوەی کۆمپیوتەرێک درووست بکەن بە ڕاستی بیر بکاتەوە! نەیاندەزانی ناوی چییە و چۆن کار دەکات! بەڵام گفتوگۆکەیان لەوێ ئەو پریشکەی دروست کرد کە شتێکی لەو شێوەیە دەکرێت بوونی هەبێت! پاش ئەوە بەرزی و نزمی زۆر بەسەر دۆخی ئەم بیرۆکەیەدا هات و بۆ ماوەی چەند ساڵێک بیرۆکەکە بە بێ بنەما و پڕ و پووچ نیشان درا، تاوەکو دواجار لەگەڵ سەردەمی مۆدێرندا زانرا یەکێک بووە لە گرنگترین و باشترین داهێنانەکانی تەکنەلۆژی و ئەوەتا ئێستا زۆرینەی شتەکان لە ڕێگەی ژیری دەستکردەوەیە!



پێش ئەوەی بە تەواوەتی بچینە ناو بابەتی ژیری دەستکرد و باسکردنی بابەتە کە با زانیاریەکی کەمان هەبێت لەسەر ژیری گشتی و بە کورتی بزانین

## ژیری گشتی چییە ؟! یان ژیری هزری قوڵ چییە ؟!

### ژیری گشتی:

ئامێرێک کە خاوەنی ژیری گشتیبێت تواناى وەڵامدانەوەی ڕێژەیەکی ئێجگار زۆر لە کێشەکانی هەیە هاوشێوەی مرۆڤەکان، چەند ڕێگایەک هەیە بۆ بەدەستهێنانی و پەرەپێدانی ژیری گشتی، هانس مۆراڤێک و مارڤین مینسکی کە زانای بواری ژیری دەستکردن، دەڵێن دەکرێت کارکردن لەسەر ژیری دەستکردن لەبوارە جیاجیاکاندا بکرێت بە یەک و کۆبکرێنەوە لە سیستمی بەهێزدا کە خاوەنی ژیری گشتیبێت، هەروەها هەندێک پێیان وایە تایبەتمەندییە ئەنترۆپۆمۆرفیزمییەکان کە بەواتای "مرۆڤاندن" دێت، وەک مێشکی دەستکرد دکرێت بەدەستبهێنرێت کاتێک ژیری گشتی زیاتر بەرەوپێشدەچێت.

## ژیری هزری قوڵ DeepMindچییە؟

زانستێکە، قۆناغێکی گەورەی دیکەی تەکنەلۆژیای ژیری دەستکردە. ڕێگە بە ئامێرەکان دەدات خۆیان لە خۆیاندا فێر بن. پشت بە زانیارییەکانی خۆیان دەبەستن تا ئەو کارانە ئەنجام بدەن کە لە توانادایە. بەڵام ئەم زانستە کەمتر دیارە. دەکرێت لە قۆناغەکانی داهاتووی ژیری دەستکرد بەکاربهێنرێت، بەڵام بە هەمان شێوە ئەو کۆمپانیایەی گرنگی زۆرتر بەم لایەنەی ژیری دەستکرد دەدات گووگڵە.

سێرێکی ڕۆبۆتی *سۆفیا بکەن کە چۆن زانیارییەکانی خۆی بەکاردێنێت بۆ وەڵامدانەوە.



*سۆفیا یەکێکە لە ڕۆبۆتە بەناوبانگەکانی جیهان کە لە دواتردا بە شێوەیەکی ورد باسی دەکەین.

## زیرەکی دەستکرد چۆن جیاوازە لە زیرەکی مرۆڤ؟

بێ گومان ئەو زیرەکیەی کە مرۆڤ هەیەتی و خودای گەورە خولقاندویەتی جیاوازە لەو زیرەکیەی کە بە دەستکرد دروست دەکرێت .

زیرەکی دەستکرد و ئەو ئەلگۆریتمانەی کە وادەکات ئەم زیرەکییە کار بکات لە لایەن مرۆڤەوە دارێژراون، وا دەکات کۆمپیوتەر فێربێت لەگەڵ دەوروبەری خۆی بگونجێنێت و فێر بێت و گەشە بکات، بەڵام لە کۆتاییدا هەر لە لایەن مرۆڤەوە درووست کراوە، زیرەکی مرۆڤ توانایەکی زۆر زیاتری هەیە لە زیرەکی ژیری دەستکرد، بە تایبەتی لە بابەتی کۆمەڵایەتی، بۆ نموونە قورس دەبێت بە بەکارهێنانی ژیری دەستکرد ئامێرێک درووست بکرێت تەواوی نەریتە کۆمەڵایەتییەکانی ژیانی کەسێک بزانێت و لەگەڵ کۆمەڵگاکەی رێک بکەوێت! و زۆر باسی تر، لە کۆتاییدا ژیری دەستکرد خاوەنی IQ نین، ئەمانە و هۆکاری دیکە وادەکات زۆر جیاواز بێت لە زیرەکی مرۆڤ، زۆر لایەنی بیرکردنەوە و بڕیاردان هەن کە ژیری دەستکرد ناتوانێت شارەزای بێت بە سادەیی، هەستەکان شتێک نین کە ئامێرێک ڕا بهێنیت بۆی، بە کورتی بیری مرۆڤ زۆر لەوە گەورەترە لە ئامێرێکدا کۆ بکرێتەوە! هەر خۆی درووستی کردووین و هەر خۆی دەزانێت چۆن!.

## ئەی ئای چۆن بەکارهاتووە؟

زیرەکی دەستکرد بە گشتی دەکەوێتە ژێر دوو پۆلێنی فراوانەوە:

تەسکی AI : هەندێک جار بە " لاوازی AI " ناودەبرێت ، ئەم جۆرە زیرەکیە دەستکردانە لە چوارچێوەی سنورداردا کار دەکەن و لە شێوەی لێچوونی زیرەکی مرۆڤن . تەسکی AI زۆرجار جەخت لەسەر ئەنجامدانی تاکە ئەرکێک دەکاتەوە کە زۆر بەباشی ئەنجام بدات و لەکاتێکدا ئەم ئامێرانە لەوانەیە زیرەک دەرکەون لەژێر سنوور و سنووری زۆر زیاتر دا کار دەکەن وەک لە سەرەتاییترین زیرەکی مرۆڤ .



هەواڵگری گشتی دەستکرد (AGI): AGI، هەندێک جار بە (AI بەهێز) ناودەبرێن، ئەو جۆرە زیرەکیە دەستکردانەیە کە لە فیلمەکان دا دەیانبینین، وەک ڕۆبۆتەکانی وێستووڕلاند یان داتای ستار ترێک: نەوەی داهاتوو AGI ئامێرێکە زیرەکی گشتی هەیە و ، زۆر وەک مرۆڤ دەتوانێت ئەو زیرەکییە جێبەجێ بکات بۆ چارەسەرکردنی هەر کێشەیەک..



## زیرەکی دەستکرد چۆن کار دەکات؟

بۆ ئەوەی بزانین ژیری دەستکرد چۆن کاردەکات پێویستە زانیاریمان هەبێت لەبارەی کۆمەلێک تولّی گشتی کە بەکار دەهێندرێن لە بوارەکەدا و لێرەدا هەولدەدەین بە شێوەیەکی پوخت باسیان بکەین بۆ خوێنەران :

تولّی Machine Learning فێربوونی ئامێر:

یەکێک لە بەناوبانگترین تولّ (بەش) ژیری دەستکرد بریتییە لە فێربوونی ئامێرەکان، ئەم بەشە تورە دەمارییەکان بەکار دەهێنێت بۆ تێگەشتن لە زانیارییە وردەکان ، بە بێ ئەوەی پرۆگرام بکرێت بەوەی بەدوای چیدا بگەرێت و چی ئەنجام بدات، یەکێکە لە باوترین رێگاکانە بۆ زیاد کردنی زیرەکی ئامێرەکان بە پێی کات و بەکارهێنانی زۆر بەربلاوە.



**فێربوونی قووڵDeep Learning :**

تولێکی دیکەیە هاوشێوەی فێربوونی ئامێرەکان، بەڵام ڕێژەیەکی زۆر گەورەتر لە تۆڕە دەمارییەکان بەکار دەهێنێت بۆ فێر بوون و چارەسەر کردنی داتاکان.




**کۆمپیوتەرێک کە مەعریفەی هەبێتCognitive computing:**

ئەم تولە یەکێکە لە گرنگترین تولەکان، وا لە ڕۆبۆتەکان دەکات هاوشێوەی مرۆڤەکان کارلێک بکات لەگەڵ ئامێرەکاندا، واتە وەک مرۆڤێک ڕۆبێتێک بیر بکاتەوە و وەڵام بداتەوە و ببیستێت.

### تۆڵی بینایی کۆمپیوتەرComputer vision :

ئەم توڵەش یەکێکە لە گرنگترین توڵەکان، وا دەکات ڕۆبۆتەکە لە کاتی ئێستادا بژێت، واتە ببینێت و ڤیدیۆ بگرێت لە کاتی خۆیدا بە بەکارهێنانی تۆڕە دەمارییەکان و تێگەشتن لەم ڤیدیۆ و وێنانەی ژیان و لێکدانەوە بۆی.



زۆر جار جیاوازی لە نێوان تولەکان و زیرەکی دەستکرد دا ناکرێت بۆ زیاتر تێگەیشتن و جیاوازی کردن لەنێوانیاندا باسێکی کورتی دەکەینەوە:

## جیاوازی نێوان Artificial intelligence و Machine Learning و Deep learningچیە؟

زیرەکی دەستکرد وەک لە ناوەکەیەوە دیارە زیرەکیەکە کە لەلایەن مرۆڤەوە دروست کراوە و وەک باشترین چارەسەر دانراوە بۆ ئەو ئیشانەی کە لەلایەن ئێمەوە ناتوانرێت ئەنجام بدرێت،کەواتە ئەتوانین بڵێین زیرەکی دەستکرد توانای ئامێرەکانە بۆ کارکردن و بیرکردنەوە وەک مێشکی مرۆڤ.



ـ Machine learning: بەشێکە لە زیرەکی دەستکرد، واتە ئامێرەکان ئەتوانن فێربن لەسەر ئەساسی ئەو داتایانەی بۆیان دابینکراوە، ئەمە زیاتر وەک ڕێگەیەک وایە کە وامان لێ ئەکات هەست بە ئامادەبونی زیرەکی دەستکرد بکەین، ئەم ڕێگەیەش ئەلگۆریزمەکان بەکار ئەهێنێت بۆ بەدەستهێنانی زانیاری و فێربون و پاشان شیکردنەوەی زانیاریەکان.

ئەنجامەکەشی لە شێوەی پێشبینیکردندا دەردەکەوێت،لەوانەیە تێبینی ئەوەت کردبێ هەنێک پێشنیارت بۆ دێتەبێش کاتێک سەردانی سایتێکی بازارکردن دەکەیت یان گوگل و فەیسبووک بە هەمان شێوە.

ـ Deep learning: بەشێکەلە مەشین لێرنینگ یان شێوازێکی قوڵتری مەشین لێرنینگە و جیاوازی لەگەڵ مەشین لێرنینگا ئەوەیە کە مەشین لێرنینگ پێوەستی بە ڕینمای و ئاراستە کردن هەیە بۆ ئەنجامدانی ئیشەکان بەڵام دییپ لێرنینگ خۆی شتەکان ئەنجام دەدات بێ ئەوەی پێوەستی بە دەست تێوەردانی پرۆگرامەر هەبێت، بیهێنە پێش چاوی خۆت کە کۆدێکت بۆ پانکەیەکی ئەلیکترۆنی نوسیوە بۆ ئەوەی دابگیرسێ کاتێک کە پێت وت "دەستپیبکە" ،

لەم کاتەیا مەشین لێرنینگ ئەم کارەت بۆ دەکات و گوێ لە تەواوی ڕستەکە دەگرێ و بە دوای وشەی "دەستپێبکە" دا دەگەڕێ، ئەگەر لە وشەکە تێنەگەیشت بە تەواوی ئەوا پانکەکەش داناگیرسێ ،بەڵام لە دییپ لێرنینگ مۆدێلا پانکەکە دائەگیرسێ تەنانەت ئەگەر بشڵێی "ئەم ژورە زۆر گەرمە بۆ مانەوە ."

*** کەواتە دەتوانین بڵێین machine learning و deep learning چەند شێوازێکی قووڵترن بۆ گەیشتن بەArtificial intelligence .



## پێویستە کە باسی Ai ی دەکەین بابەتێکی گرنگیش هەیە لەبیری نەکەین و زانیاریمان هەبێت لەسەری(Open AI) :

ئۆپن ئەی ئای OpenAI( واتە ژیری دەستکردی کراوە) تاقیگەیەکی توێژینەوەی ژیری دەستکردە کە لە کۆمپانیای قازانجنەویستی ئۆپن-ئەی-ئای ئێل-پی و کۆمپانیای باوانی، کۆمپانیای قازانج نەویست ئۆپن-ئەی-ئای ئینک (Inc)پێکهاتووە. کۆمپانیاکە توێژینەوە لە بواری ژیری دەستکرد ئەنجام دەدات بە ئامانجی بانگەشەبۆکراوی برەودان و پەرەپێدانی زیرەکی دۆستانە بە شێوەیەک کە سوود بە مرۆڤایەتی بە گشتی ببەخشێت. ڕێکخراوەکە لە سان فرانسیسکۆ دامەزراوە لە کۆتاییەکانی ٢٠١٥ لەلایەن سام ئاڵتمان، ئیلۆن ماسک و ئەوانی ترەوە، کە پێکەوە بەڵێنی سەرمایەگوزاری یەک ملیار دۆلاری ئەمریکیان داوە. مەسک لە شوباتی ٢٠١٨ لە لیژنەکە دەستی لەکار کێشایەوە بەڵام وەک بەخشەرێک مایەوە. لە ساڵی ٢٠١٩، ئۆپن-ئەی-ئای ئێل-پی وەبەرهێنانی ١ ملیار دۆلاری ئەمریکی ئەمریکی لە مایکرۆسۆفت وەرگرت. ئۆپن-ئەی-ئای بنکەی سەرەکی لە بینای پایۆنەری شاری سان فرانسیسکۆیە.

## زیرەکی دەستکرد لە چ بوارێکدا بەکار دێت ؟

زیرەکی دەستکرد بە سەدان شێوە لە هەموو دەوروبەرمان بەکاردەهێنرێت، جیهانی ئێمەی گۆڕیوە و ژیانی ئێمەی ئاسانتر و سەرنجڕاکێشتر کردووە، هەندێک لەو بەکارهێنانە زۆرانەی AI کە ڕەنگە بیستبێتت بریتین لە:

- ناسینەوەی دەنگ.
- ئۆتۆمبێلە خۆلێخوڕەکان.
- چاتبۆتەکان(وەڵامدانەوەی نامەکان بو شێوەیەکی خۆکارانە).
- بازاڕی کردنی ئۆنلاین.
- لەبواری پەروەردەییدا.
- یاریە ئەلکترۆنیەکان.
- خزمەتگوزارییەکانی پەخش کردن.
- لە بواری پزیشکیدا ..........چەندین بواری دیکە .



لێرەدا بەس لە بەکار هێنانەکانی دەکە ین لە چەند بوارێکدا بۆ زیاتر تێگەیشتن لە ژیری دەستکرد و بەرەوپێش چوونی.

گرنگترین بوار دروستکردنی چات بۆتەکانە و بەناوبانگترین چات بۆتەکان بە شێوەیەکی گشتی ئەمانەن:

- ChatSpot
- ChatGPT
- Bing Chat
- Bard
- Jasper Chat
- Perplexity
- Tidio Lyro
- Kommunicate

- HubSpot Chatbot Builder
- Intercom
- Watson Assistant
- Appy Pie Chatbot
- Zendesk Answer Bot
- Salesforce Einstein
- LivePerson
- Ada



بەناوبانگترین چات بۆت کە سەرنجی هەموانی بەلای خۆیدا راکێشابێت چات جیپی تیە لێرەدا باسێکی دەکەین بە شێوەیەکی کورت:

لە ڕۆژگاری ئەمڕۆی تەکنەلۆژیادا بابەتی چات بۆتەکان و مۆدێلەکان سەرنجی بەکارهێنەرانی ئینتەرنێتی ڕاکێشاوە بەتایبەت بەم دواییانە کە Chat GPT دەرکەوتووە.

چات جی پی تی (بە ئینگلیزیChat GPT : بە عەرەبی: تشات جي بي تي) کورتکراوەی گۆڕەری پێش-ڕاهێنراوی بەرهەمهێنە Generative Pre-trained Transformerهاوشێوەی ئامڕازێکی چات کردن بەکاردێت و لەسەر کۆمەڵە داتایەکی زۆری ئینتەرنێت ڕاهێنراوە.



سالّی ٢٠١٨ کۆمپانیای (OpenAI) که تایبه‌ته به توێژینه‌وه‌ی زیره‌کی ده‌ستکرد، یه‌که‌م نه‌وه‌یGPT ـی بڵاوکرده‌وه و دواتر ٢ نه‌وه‌ی تری به‌دوادا هات کۆتا دانه‌ی له تشرینی دووه‌می ٢٠٢٢ بوو، هه‌ریه‌که‌یان خاوه‌نی تایبه‌تمه‌ندی باشتر له نه‌وه‌ی پێش خۆیانن Chat GPT . بۆ دروستکردنی نووسینی هاوشێوه‌ی مرۆڤ دارێژراوه و ده‌توانرێت بۆ چه‌ندین ئه‌رکی پرۆسێسکردنی زمان وه‌ک وه‌رگێڕان، کورتکردنه‌وه‌ی ده‌ق و درووستکردنی گفتوگۆ به‌کاربهێنرێت. ئه‌م چاته ده‌توانێت وه‌ڵامی پرسیاره‌کان بداته‌وه و له ئه‌رکه‌کانی وه‌ک ئاماده‌کردنی ئیمه‌یڵ و وتار و ته‌نانه‌ت له چاره‌سه‌ر کردنی کێشه‌کانی پرۆگرامسازیدا یارمه‌تیت بدات. له ئێستادا به‌کارهێنان به‌خۆڕایی بۆ هه‌مووان به‌رده‌سته چونکه له قۆناغی توێژینه‌وه و کۆکردنه‌وه‌ی فیدباکدایه.



## Chat GPTچۆن کار دەکات؟

لە ڕووکەشدا تەکنەلۆژیای GPT سادەیە. داواکارییەکان، پرسیارەکانت یان ئامۆژگارییەکانت وەردەگرێت و بە خێرایی وەڵامیان دەداتەوە.

بەڵام لەڕاستییدا تەکنەلۆژیای ئەنجامدانی ئەم کارە زۆر ئاڵۆزترە لەوەی کە بیری لێ دەکەیتەوە. ئەم مۆدێلە بە بەکارهێنانی بنکەی زانیاری دەقی لە ئینتەرنێتەوە ڕاهێنراوە. ئەمەش داتایەکی گەورەی بە قەبارەی ٥٧٠ گێگابایت لەخۆگرتووە کە لە کتێب، ویکیپیدیا، وتار و پارچە نووسینەکانی تر لە ئینتەرنێتدا بەدەست هاتووە. بە جۆرێکی تر دەتوانین بڵێین زیاتر لە ٣٠٠ ملیار وشە خراوەتە ناو سیستمەکەوە. کاری لەسەر ئەگەر دەکات، توانای پێشبینیکردنی هەیە کە وشەی داهاتوو لە ڕستەیەکدا دەبێت چی بێت. بۆ ئەوەی بگاتە دەرئەنجامێک کە بتوانێت ئەم کارە بکات، چاتەکە لە ژێر سەرپەرشتییدا بە قۆناغی تاقیکردنەوەدا تێپەڕیوە.

بۆ نموونە کە سەرەتا پرسیاری لێدەکرێت ئەگەری هەیە بەو زانیارییانەی لە بەردەستیدایە بە ڕاستی وەڵام بداتەوە، وە لەکاتێکدا ئەگەر وەڵامەکەی هەڵە بوو، سەرپەرشتیارانی پرۆژەکە وەڵامە ڕاستەکەی فێردەکەن و زانیارییەکانی بۆ جاری داهاتوو زیاد دەکات. پاشان بە قۆناغی دووەمی هاوشێوەدا تێدەپەڕێت و

چەندین وەڵام دەخاتە بەردەست لەگەڵ ئەندامێکی سەرپەرشتیار کە لە باشترینەوە بۆ خراپترین بۆی ڕیزبەندی دەکات بەمەش مۆدێلەکە لەسەر بەراوردکردنەکان ڕادەهێنێت.

ئەوەی ئەم تەکنەلۆژیایە جیا دەکاتەوە بەردەوامبوونییەتی لە فێربوون لە هەمان کاتدا پێشبینی دەکات کە وشەی داهاتوو دەبێت چی بێت، بەردەوام تێگەیشتنی خۆی بۆ پرسیارەکان باشتر دەکات بۆ ئەوەی لە هەموو شتێک شارەزا بێت.

## چەند نموونەیەک لە بەکارهێنانی Chat GPT

سەرەتا دەتوانیت وەکو گەڕانی گووگڵ بیری لێبکەیتەوە. بەڵام تەنها کۆمەڵێک سەرچاوەی زانیاری بەسەر یەکەوە ناخاتە بەردەستت وەک ئەوەی گووگڵ دەیکات. بەڵکو زانیارییەکان بە شێوەیەکی گفتوگۆیی و هاوشێوەی ئەوەی مرۆڤ لە کاتی وەڵامدانەوەی پرسیارەکاندا دەیکات دەخاتە ڕوو. جگە لەوەش دەتوانێت وەڵامی پرسیارەکان بداتەوە بە نزیکەی لە هەر بوارێکدا وەکو زانست، بیرکاری، ئایین، وەرزش، سیاسەت....هتد

## نموونەی بەکارهێنانیChat GPT:

- دروست کردنی پەڕەی زانیاری کەسی(CV) ، ئەمە نموونەیەکە بۆ پیشەی مامۆستای ئینگلیزی کە ئەزموون، خوێندن و تواناکانی تێدایە و تۆ دەتوانی تەنها زانیاریەکانی خۆت لە جێیان دابنێییتەوە لە کاتێکدا ئەگەر بەپەلە بوویت بۆ پێشکەشکردنی ئیشێک.

- سادەکردن و ڕونکردنەوەی بابەتە ئاڵۆزەکان، ئەگەر تۆ خوێندکاریت و لە بابەتێک تێناگەیەت ئەتوانی پرسیار لە Chat GPT بکەیت و بۆت شیدەکاتەوە، تەنانەت پرسیارە قورسەکانی بیرکاریش هەنگاو بە هەنگاو شیکار دەکات.

- یەکێک لە خاڵە بەهێزەکانی GPT ئەوەیە کە توانای فێربوون و داهێنانی هەیە، بە پێچەوانەی هەندێک لە چات بۆت یان مۆدێلەکانی تری زمان GPT .*تەنها مامەڵە لەگەڵ چەمکە ڕۆبۆتییە بێ ڕۆحەکاندا ناکات، بەڵکوو شارەزایە لە هەوڵە داهێنەرەکان، لەوانەش نووسینی مۆسیقا و گۆرانی و هۆنراوە.

- وەڵامدانەوەی ئیمەیل، دەتوانرێتChatGPT بەکاربهێنرێت بۆ دروستکردنی وەڵامی کەسی و سەرنجڕاکێش بۆ ئیمەیڵەکان، ئەمەش کات دەگەڕێنێتەوە و دڵنیابوونە لەوەی کە پەیامە گرنگەکان بە خێرایی و پیشەییانە وەڵام دەدرێنەوە. بۆ نموونە دەتوانیت لە ChatGPTبپرسیت "ڕێگایەکی پیشەیی بۆ وەڵامدانەوەی ئەم داواکارییە ئیمەیڵە چییە؟" و ئەو ئیمەیڵەی مەبەستتە دابنێیت.



بێ گومان ئەم چات جی پی تییەی کە دروست کراوە و یارمەتیەکی زۆرمان دەدات کۆمەڵێک خالی لاوازی هەیە و لێرەدا باسێکی کورتی دەکەین.

## خاڵە لاوازەکانی Chat GPT :

لاوازی سەرەکی ChatGPT ئەوەیە کە لەسەر بنەمای ئەو نەخش و ئەگەرانە دامەزراوە کە لە داتاکان فێری بووە و لەسەری ڕاهێنراوە. لەوانەیە نەتوانێت لە هەندێک زانیاری تێبگات و وەڵامی بداتەوە کە لە دەرەوەی داتاکانی ڕاهێنانەکانین، توانای هەستکردن یان تێگەیشتنی نییە لەو زەمینە کۆمەڵایەتی و کولتوورییەی کە دەقێک تێیدا دەنووسرێت، بۆیە ناتوانێت دیاری بکات کە دەقێک شیاوە یان نا، چی باشە و چی خراپە و هتد.  هەروەها لەوانەیە وەڵامی هەڵە یان لایەنگری بەرهەم بهێنێت بەهۆی ئەو لایەنگرییەی کە لە داتاکاندا هەیە.

لاوازییەکی تری ئەوەیە کە دەکرێت کێشەیەکی زۆری هەبێت بۆ تێگەیشتن لە ناوەڕۆک و وەڵامی نالۆژیکی یان ناپەیوەندیدار دروست بکات.

ڕەنگە شکست بهێنێت لە تێگەیشتن لە گاڵتە و دەستەواژەکانی ناو زمان. ناتوانێت دەستی بە ئینتەرنێت بگات ئەو کاتەی پرسیاری لێدەکەیت و تەنها داتاکانی کە لە کۆتا وەشاندا بۆی زیادکراوە بەکاردەهێنێت.

لە توانایدا نییە شوێنی جوگرافی دیاری بکات لە حاڵەتێکدا ئەگەر داوای لێبکەی ئاراستەی ماڵەوەت نیشان بدات. یەکێکی تر لە لاوازییەکانی ئەوەیە جگە لە دەق و نووسین توانای وەرگرتنی هیچ ئینپوتێکی دیکەی نییە.

## ئایا چات GPT دەتوانن جێگەی مرۆڤ بگرنەوە لە ئیش و کاردا؟

گرنگە ئاماژە بەوە بکەین کە بەکارهێنانی ChatGPT دەتوانێت یارمەتی خوودکارانەکردنی ئەرکە دووبارەبووەکان بدات، بەڵام مەبەست لێی جێگرتنەوەی زیرەکی مرۆڤ نییە. پێدەچێت سەرکەوتووترین حاڵەتەکانی بەکارهێنان بۆ مۆدێلەکە ئەوانە بن کە بۆ یارمەتیدانی خەڵک بەکاردەهێنرێت، نەک بۆ جێگرەوەیان.

لە هەندێک پیشەسازیدا، وەک خزمەتگوزاری کڕیار یان داخڵکردنی داتا، چاتبۆتەکان دەتوانن ئەرکە دووبارەبووەکان و ڕۆتینییەکان جێبەجێ بکەن، ئەمەش ڕێگە بە کارمەندانی مرۆڤ دەدات سەرنجیان لەسەر ئەرکە ئاڵۆزتر و داهێنەرەکان بێت.

له کۆتاییدا دەتوانین بڵێین هێشتا کۆمەڵێک تایبەتمەندی هەیە کە زیرەکی دەستکرد و بە تایبەتیش چات بۆتەکان خاوەنی نین و زیادکردنی ئەو تایبەتمەندییانەش پێدەچێت بڕێکی زۆر لە ڕاهێنان و کاتی پێویست بێت کەواتە لە ئێستادا تەنها تاقیان بکەرەوە و چێژ یان سوود لە ئەزموونەکە وەربگرە .



شایەنی باسە زۆرێک لە زانیارییەکانی ئەم نووسینە لە خوودیChat GPT ـەوە وەرگیراوە و تۆش دەتوانیت لە ئێستاوە بەکاریبێنیت و زانیارییەکانت ئاسانتر دەست بکەوێت لەم لینکەوەhttps://chat.openai.com/chat

لێرەدادەمەوێت ئاماژە بە ئەوە بدەم چات جی بی تی دەتوانیت بەکاری بهێنیت لەرێگەی وێبسایت (مالپەر)یان ئەپلیکەیشن (بەرنامەی مۆبایل ) بەلام بەرنامەکە سنووردار کراوە لە ماوەی ٢٤ دا دەتوانیت چەند پرسیارێکی لێ بکەیت بۆیە وا باشترە سوود لە و لینکەومالپەرەکە وەر بگرین بۆ بەکار هێنان و سوود مەند بوون لە م چات بۆتە.



### لەدوای باسکردنی چات جی بی تی حەز دەکەم ئاماژە بە بارد چات بۆت بدەم بە شێوەیەکی زۆر کورت:

بارد مۆدێلێکی زمانیی گەورەیە، و بۆتێکی زیرەکی دەستکردیی گفتوگۆیە کە لەلایەن گووگڵەوە پەرەی پێدراوە، لە سەر خێزانی لامدا .(LaMDA)وەک وەڵامێکی ڕاستەوخۆ بۆ سەرهەڵدانی چات جی پی تیی ئۆپن ئەی ئایپەرەی پێدرا، و بە توانایەکی سنووردار لە مانگی ئازاری ٢٠٢٣ بەردەست خرا.




### سەرهەلدانی بارد بۆد بە کورتی:

تشرینی دووەمی ٢٠٢٢، ئۆپن ئەی ئای بە یارمەتی مایکرۆسۆفت چات جی پی تیی خستەگەڕ، چات جی پی تی دوای بڵاوبوونەوەی سەرنجی جیهانی ڕاکێشا بەڕێوەبەرانی گووگڵ بەهۆی مەترسییە ئەگەرییەکانی چات جی پی تی بۆ سەر گەڕانی گووگڵ، چەندین گرووپیان دەستنیشانکرد بۆ هەوڵدان بۆ درووستکردنی

ژیرییەکی دەستکرد AI کە ڕکابەریی ژیرییە دەستکردەکەی ئۆپن ئەی ئای بکات. لە ٢١ی ئازاری ٢٠٢٣ بە فەرمی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و شانشینی یەکگرتوو بڵاوکرایەوە.

یەکێکی دیکە لە چات بۆتەکان چات سپۆتە chatspot لێرەدا باسێکی کورتی دەکەین :

چاتسپۆت chatspot : ئامرازێک یان تولێکی گفتوگۆی زیرەکییە کە دیزاین کراوە بۆ یارمەتیدانی لە بوارەکانی فرۆشتن و بازاڕکردنی و بزنس و چەندین بواری تر ..... بە شێوەیەکی فری و بێ بەرامبەر،

کە ئەمیش هاو شێوەی چات جی پی تی رۆبۆت چاتە کانی ترە و وەلامی ئەو پرسیارانە دەداتەوە کە ئاراستەی دەکرێت.



## خاڵی لێک چووی نێوان چات جی پی تی و چات سپۆت :

هەردووکیان ڕۆبۆت چاتن وجۆرێکن لە زیرەکی دەستکرد کە توانای وەلامدانەوەیەکی هێجگار خێرایان هەیە لاکاتێکدا کە پردیارێکیان ئاراستە دەکرێت .

## خاڵی لێک جیاوازیی نێوان چات جی پی تی و چات سپۆت :

توانای زیرەکی چات جی پی تی توانای پێشکەوتووتری NLPی هەیە، کە کارلێکی مرۆیی زیاتر دابین دەکات، یان دەتوانین بلێین فراوانترە لە لایەکی ترەوە، چات سپۆت تیشک دەخاتە سەر لێشاوی گفتوگۆی پێکهێنراو کە لەوانەیە هەست بە سنووردارتر بکات بە بەراورد لەگەڵ وەڵامە کراوەکانی چات جی پی تی.



## بینگ چات بۆت Bingchat:

ئەمیش هاوشێوەی ئەو چات بۆتانەیە کە لە  پێشتردباسمان کردوە.

توانای وەلامدانەوەی پرسیارە جۆراو جۆرەکانی هەیە کە ئاراستەی دەکرێت و وەلامی هەموو پرسیارەکان دەداتەوە لەسەر ئەساسی ئەو زانیاریانەی کە لایەتی و سوودیان لێوەردەگرێت .یەکێک لە تایبەت مەندیە باشەکانی ئەم چات بۆتە ئەوەیە کە دەتوانێت وێنەو ئایکۆنمان بۆ دروست بکات کەداوامانلێکرد لەرێگەی تایبەتمەندیbing imge creator و لەکاتێکدا تۆ داوای وێنەیەکی لێدەکەیت ئەو چەندین وێنەی جۆراوجۆرت بۆ دەهێنێت و کامەی گونجاوبێت دەتوانیت دەستنیشانی بکەیت .یەکێک لە تایبەت مەندیە باشەکانی ئەم چات بۆتە ئەوەیە کە دەتوانێت دەق و نوسینمان پێ بدات بە فۆنت و تۆنی جۆراو جۆر کەدەتوانین بەکاری بهێنین و بەکاردێت بۆ نووسینی چیرۆک و هۆنراوەو چەندین بابەتی تری جۆراو جۆر .



## بەراوردی چات جیبیتی بە چات بۆتەکانی دیکە :

ئەوانەی باسمانکرد هەمویان چات بۆتن و گونجاون بۆ ئەنجامدانی ئەو داواکاریانەی کە ئاراستەیان دەکرێت بەلام ئەوەی گرنگە بیزانین ئەوەیە کە چات جی پی تی لە ئێستادا پێشەنگە و ناتوانرێت بەراورد بکرێت بە چات بۆتەکانی دیکە .





Bard vs CHAT-GPT vs BingAI

## گرنگە چات بۆتەکان سنووردار بکرێن ؟

ئەوەی کە گرنگە ئاماژەی پێبدەین سنوردار کردنی چات بۆتەکانە چاتبۆتەکان زۆرجار بەکاردێن بۆ بەڕێوەبردنی چەندین ئەرک لە یەک کاتدا، بەڵام ئەمە دەتوانێت ببێتە هۆی فرە ئەرکی ناپێویست کە کاریگەرییان کەم دەکاتەوە.

لەوانەیە لە هەمان کاتدا کێشەی هەبێت بۆ بەڕێوەبردنی چەندین ئەرک، کە دەبێتە هۆی دواکەوتن و هەڵە و کوالێتی خزمەتگوزاری کەمتر.

دەمەوێت ئاماژە بەوە بدەم کە ئێمە ژمارەیەکی زۆر چات بۆتمان هەیەو کە ناکرێت لێرەدا ئاماژەبە هەموویان بدەین و بەوردی باسی هەموویان بکەین لەبەر ئەوەی بە سەدان پەرە تەواو نابین و خوێنەریش رەنگە حەزبە دوورودرێژی بابەتەکەنەکات .

## یەکێک لە بۆتە گرنگەکان دەنگبۆت (ڤۆیس بۆتە voicebot ):

بۆتی دەنگ (بە ئینگلیزی: Voicebot) چارەسەرێکی گفتوگۆییە کە بەرهەمی زیرەکی دەستکرد (AI) یە و تێگەیشتنی زمانی سروشتی (NLU) بەکاردەهێنێت بۆ یارمەتیدان لە لێکدانەوەی مەبەست و مانا لە فەرمانەکانی قسەکردندا. ئەم تەکنەلۆژیایە ناسراوە بە وەڵامدانەوەی دەنگی کارلێکی گفتوگۆ (IVR) ، ڕێگە بە بەکارهێنەران دەدات کارلێک لەگەڵ ئامێرێکدا بکەن بە سادەیی لە ڕێگەی قسەکردن.



چونکە دەنگ یەکێکە لە خێراترین شێوەکانی پەیوەندیکردنی مرۆڤ، بۆتە دەنگییەکان ئاستێکی دووەمی خزمەتگوزاری باش پێشکەش دەکەن بە پێشکەشکردنی ڕێگایەکی تر بۆ وەلامدانەوە.

ئەمە تەنها تێگەیشتن لە وشەکان نییە. بۆتە دەنگییەکان ئەوە دیاری دەکەن کە بەکارهێنەر چی دەوێت و ڕێنماییان دەکات بۆ وەڵامدانەوەیەکی کاریگەر.

بە بەردەوامی باشترکردنی خۆی و ئەزموونی بەکارهێنەر ، بۆتە دەنگییەکان دەتوانن چەندین ئەرک لە یەک کاتدا و بە سەرکەوتوویی بەدەست بهێنن.



## بۆتی دەنگ چۆن کار دەکات؟

بۆتەکانی دەنگ لە زمانی سروشتی تێدەگەن و دەتوانن دەست بکەن یان بەشداری بکەن لە پەیوەندییەکی دوو لایەنە لەگەڵ بەکارهێنەران. بە فەرمانی بەکارهێنەر، بۆتەکانی دەنگ دەتوانن مۆدیول بەکاربهێنن بۆ گوێگرتن، تێگەیشتن، و فێربوون بە درێژایی بەکارهێنانیان.

بۆتی دەنگ ئەم بەرنامە و پرۆسانەی خوارەوە بەکاردێنێت کاتێک کارلێک لەگەڵ بەکارهێنەرێک دەکات:

- قسەکردن بۆ دەق (Speech to Text): ناسینەوەی دەنگ و وەرگێڕانی تێکردن ناسراو بە ئاخاوتن-بۆ-دەق (STT) ، قسەکردنی سروشتی دەگۆڕێت بۆ دەق بە ناسینەوەی جیاواز و زمانە جیاوازەکان.
- دەق بۆ قسەکردن( Text to Speech) لەگەڵ بزوێنەری دەق بۆ قسەکردن (TTS) ، بۆتێکی دەنگ دەق دەهێنێت بە وەرگێڕانی بۆ قسەی دروستکراو.
- بزوێنەری NLU. ئەمە یارمەتی بۆتەکان دەدات لە پرسیار و وشە و ڕستەکان تێبگەن بۆ ئەوەی بەکارهێنەر بتوانێت بە ئازادی قسە بکات و دەستبەجێ وەڵام بداتەوە بە زیاتر لە وەڵامی "بەڵێ" و "نەخێر".

- نەوەی زمانی سروشتی بە ئینگلیزی Natural language generation (NLG) : وەڵامەکان وەرگێڕدراون بۆ زمانێک کە بەکارهێنەر لێی تێدەگات.
- دۆزینەوەی زمان : زمان و دیالێکتی بەکارهێنەرەکە دەناسرێتەوە و بۆتی دەنگ بە شێوەیەکی ئاسان دەگۆڕدرێت بۆ ئەو زمانە.
- فێربوونی ئامێر(Machine learning) : بۆتی دەنگ بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی خۆی لە پرسیار و داتاکانی بەکارهێنەرەوە فێردەبێت و ئەم فێربوونە زیاد دەکات بۆ بنکەی زانیاری دەنگی بۆت.



## چات بۆتەکان ودەنگ بۆتەکان :

دەنگبۆتەکان گفتوگۆی دەنگی UI بەکاردەهێنن بۆ تێگەیشتن و وەڵامدانەوەی ڕێنماییە قسەکراوەکان یان پرسیارەکانی بەکارهێنەر. چاتبۆتەکان هەمان شت دەکەن، بەڵام لە جیاتی قسەکردن دەق بەکاردەهێنن.

بەلام ئەوەی گرنگە بیزانین هەردووکیان سوودبەخشن و توانای وەلامدانەوەی پرسیارە جۆراو جۆرەکانیان هەیە .



یەکێکی تر لە بوارە هەرە گرنگەکان رۆبۆ تینگە کە بەشێکی گرنگی زیرەکی دەستکردە لێرەدا چەندنموونەیەک لە ناوی رۆبۆتە ژجیهانیە کان دادەنێین و باسی گرنگترینیان دەکەین:

- Sophia
- R2-D2
- Junco Chihira
- Kuri
- Jibo
- ROYBI
- Willow
- Misty
- Vector Robot



که باسی رۆ بۆتیش دەکەین ئەوەی زانیاریەکی کەمی هەبێت خێرا بیری بۆ لای رۆبۆتی جیهانی زۆر بەناوبانگ سۆفیا دەروات  لێرەداباسێکی سۆفیارۆبۆت دەکەین :

سۆفیا ڕۆبۆرتێکە لە شێوەی مرۆڤ دروستکراوە لە لایەن کۆمپانیای " هانسون روبوتیکس" ، وا دروستکراوە کە فێرببیت و بگونجێت لەگەڵ شێواز و هەڵسوکەوتی مرۆڤ ، سۆفیای ڕۆبۆت لە 19ی مانگی 4 ی 2015 ئەکتیڤ کرا، لە ڕووی ڕووخسارەوە وا دیزاین کراوە کە شیوهی ئه کته ری به ریتانی ئودری هیبورن بنوینیت ، سوفیای ڕۆبۆرت بە جۆرێک دروستکراوە کە توانای قسەکردن و وەلامدانەوەی مرۆڤ و تەنانەت نواندنی ڕووخسار بۆهەستەکانی بکات، دەیڤید هانسون" بەڕێوبەری جێبەجێکاری کۆمپانیانی "هانسون روبوتیکس " لە هەمان کاتدا دارێژەری سۆفیای ڕۆبۆرتە ئەم ڕۆبۆرتەی بۆ ئەوە دروستکردووە کە ببێتە هاوڕێی باش بۆ  بەتەمەنەکان و خانەی بەسالاچوەکان .



سۆفیا لە ئۆکتۆبەری 2017 بوو بەخاوەن ڕەگەزنامەی وڵاتی سعودیة ، ئەمەش بۆ ئەوە بوو کە سوفیا ببێتە یەکەم ڕۆبۆرت کە خاوەن ڕەگەزنامە بێت.

ئەوەی زۆر گرنگ بوو و زۆر دەنگدانەوەی لێ کەوتەوە سۆفیا یەکێک بوو لە و ڕۆبۆتانەی کە توانی رەگەز نامە وەر بگرێت ئەمەش دەنگدانەوەیەکی زۆری لێ کەوتەوە ئەمەی لێرەش دایە کورتەی باسەکەیە کە لە سایتێکی کوردیەوە وەرم گیراوە :

ڕۆبۆتێکی ژن بەناوی سۆفیا دەبێتە خاوەنی رەگەزنامەی شانشینی سعودیە، لە بەرنامەیەکدا ئاشکرایدەکات کە شانازی بەو رەگەزنامەیەوە دەکات.بۆ یەکەمجارە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا رۆبۆت هاوشێوەی مرۆڤ رەگەزنامەی وڵاتێکی هەبێت، بەڵام سۆفیا لە مونتەدایەکی ئابووری نێودەوەڵەتی لە ریازی پایتەختدا رەگەزنامەو پاسپۆرتی سعودیەی وەرگرت.

سۆفیا هاوشێوەی مرۆڤ دروستکراوەو وەک مرۆڤەکانیش قسەدەکات، لەتوانایدایە بەپێی بۆچوونەکان شێوەی رووخساری بگۆڕێت و قسەی بەرانبەرەکەی تێدەگات و توانای گفتوگۆکردنی هەیە، کۆمپانیای هانسۆن رۆبۆتیکس بەرهەمی هێناوەو سۆفیا لەسەر شێوەی هاودری ئیبۆرنی خانمە هونەرمەند دیزاینکراوە.

لەنێو سەری سۆفیادا کامێرا و پرۆگرامی کۆمپیوتەری هەیە کە دەتوانێت مرۆڤەکان بناسێتەوە، تەنها ئەوەندەی ماوە لایەنی هەست و سۆزی هەبێت.

لە چەند قسەکەیدا ئەو رۆبۆتە دەڵێت "من دەتوانم فێرببم کە مرۆڤ چییە! تەمەننا دەکەم لە داهاتوودا بەباشترین شێوە لە مرۆڤ تێبگەم".

لێرەداباسی سۆفیا رۆبۆتمان کرد بەلام کۆمەلێک رۆبۆتی ترمان هەیە لێرەداباسی چەنددانەیەکیان دەکەین بەشێوەیەکی کورت.

1 - میستی رۆبۆت(Misty):

میستی گەشەی پێدرا وەک ڕۆبۆتێکی ڕوونکراوەی دەستکرد بۆ ناسینەوەی شێوەکانی داتای بینراو و دەنگ، ئەمەش ئاسانکاری دەکات بۆ بەکارهێنەران بۆ تێگەیشتن لەوەی چۆن سیستەمەکانی زیرەکی زانیاری پرۆسە دەکەن. میستی ڕۆبۆتێکی سەربەخۆیە کە زیرەکی دەستکرد بەکاردەهێنێت بۆ فێربوون و وەڵامدانەوەی ژینگەکەی. چەندین هەستەوەری جۆراوجۆری هەیە، کامێرا و مایکرۆفۆن کە ڕێگەی پێدەدات کارلێک لەگەڵ ژینگەکەیدا بکات.

میستی دەتوانێت خەڵک و شتەکان و دەربڕینەکانی دەموچاو بناسێتەوە، هەروەها لە زمانی سروشتی تێبگات. دەتوانرێت بە شێوەیەکی سەربەخۆ بجوڵێت و بەرنامە بۆ ئەنجامدانی ئەرکی دیاریکراو دروست بکرێت. هەروەها میستی توانای فێربوونی شارەزایی نوێی هەیە لە ڕێگەی ئامرازەکانی زیرەکی ڕوونکراوەوە.

2 - کوری رۆبۆت(Kuri):

ڕۆبۆتی زیرەک ، کوری - دەتوانێت شێوازی بەکارهێنانی زیرەکی لە ماڵەکانمان بگۆڕێت ئەم ڕۆبۆتە پڕە لە تەکنەلۆژیای پێشکەوتوو و زیرەکی دەستکردی سەرنجڕاکێش، ئەم ڕۆبۆتە هاوڕێیەکی زیرەکە کە دەتوانێت کارلێک لەگەڵ ژینگەکەیدا بکات و تەنانەت ڕوخساری مرۆڤیش بناسێتەوە.

لەگەڵ کۆمەڵێک تایبەتمەندی وەک ناسینەوەی دەنگ و دۆزینەوەی جووڵە، کوری لە پێداویستییەکانی بەکارهێنەرەکانی تێدەگات و چالاکانە یارمەتییان دەدات لە ئەرکە جۆراوجۆرەکان، لەوانە کەمکردنەوەی بەکارهێنانی وزە.

3 - ڕۆبۆتسپیان(RoboThespian):

ڕۆبۆت ڕۆبۆتێکی زیرەکی زیرەکە کە ئەزموونی ڕابواردن و پەروەردە و کارلێک دابین دەکات. وەک ئەکتەرێکی ڕاستەقینە، توانای دەربڕینی دەموچاوی هەیە، گۆڕانکاری لە ئینتۆنی دەنگ، و کۆمەڵێک دیالۆگی کارلێک. ئامرازێکی بەهێزە کە لە مۆزەخانەکان و پێشانگاکان و شوێنە گشتییەکانی دیکەدا بەکاردێت، چونکە دەتوانێت ئەزموونێکی سەرنجڕاکێش بۆ سەردانکەران دابین بکات.

ئەوەی وا لەم ڕۆبۆتە تێسپیانییە دەکات ئەوەندە سەرنجڕاکێش بێت ئەوەیە کە دەتوانرێت بەرنامە بۆ هەر نمایشێکی شانۆیی یان سیناریۆیەکی کارلێکی تر بگونجێت، تەواو لەگەڵ کەسایەتییەک لە دۆستانەوە بۆ گوماناوی کە هەر بینەرێک بەشدار دەکات.

4 - ڕۆیبی(ROYBI):

ڕۆبۆتی زیرەکی ڕۆیبی ئامێرێکی نوێیە کە توانای تەکنەلۆژیا دەهێنێتە ناو ئەزموونی فێربوونی منداڵەوە. بە دیزاینە سادەکەی، ئەم ڕۆبۆتە لەگەڵ منداڵێک کارلێک دەکات و یارمەتییان دەدات بۆ فێربوونی زمان و بیرکاری و زانست و زیاتر بە شێوەیەکی خۆش و سەرنجڕاکێش.

به بەکارهێنانی زیرەکی دەستکردی نوێ، یاری ڕۆبۆتی ڕۆیبی ئەزموونێکی فێربوونی تایبەتمەند پێشکەش دەکات بۆ هەر بەکارهێنەرێک.

5 - ویلۆرۆبۆت(Willow):

ڕۆبۆتی زیرەکی دەستکرد تێکەڵەیەک لە ئەلگۆریتم و کامێرای زیرەکی دەستکردی پێشکەوتوو بەکاردەهێنێت بۆ ناسینەوە و وەڵامدانەوەی دەوروبەری. بە سیستەمێکی پێشکەوتووی پرۆسەکردنی بینراو، ویلۆ توانای لێکۆڵینەوەی ژینگەیی خۆی هەیە و نەخشەیەک دروست دەکات. ئەمە وا لە ڕۆبۆتەکە دەکات ئامرازێکی بەهێز بێت بۆ بەکارهێنانی جۆراوجۆر، وەک دابینکردنی یارمەتی لە ئۆپەراسیۆنەکانی چاودێریکردن یان تەنانەت یارمەتیدانی دەوروبەری ماڵەوە.

دەتوانێت جووڵە و دەنگ بدۆزێتەوە، کە دەتوانێت خاوەن ماڵەکە ئاگادار بکاتەوە لە هەر چالاکییەکی گوماناوی. هەروەها دەتوانرێت بەرنامە بۆ ناسینەوەی دەموچاو و دەنگ دروست بکرێت. هەروەها ویلۆ دەتوانرێت بەرنامەی بۆ بکرێت بۆ تۆمارکردنی ڤیدیۆ و دەنگ، ڕێگە بە بەکارهێنەر دەدات لە دوورەوە چاودێری ماڵەکەی بکات لە ڕێگەی ئەپی مۆبایلەوە.

لەبواری پزیشکیشدا بێگومان زیرەکی دەستکرد بەکار دێت بۆ ئەمەش چەند نموو نەیەک باس ئەکەین :

نانۆ رۆبۆت لە بواری نەخۆشی ژێرپەنجەدا : زاناکان گەشەیانداوە بەجۆرێك ڕۆبۆتی بچووك کە بە دەرزییەك دەدرێت لە نەخۆشانی شێرپەنجە بەمەبەستی لەناوبردنی خانەکانی ئەو نەخۆشییە، ئەمەش شۆرشێکی نوێیە لەبواری پزیشکیدا.پێگەی (هایل براکسیس)ی ئەڵمانی ئاشکرایکردووە زانایانی چین و بەریتانیا نەوەیەکی نوێی نانۆ ڕۆبۆتیان دروستکردووە کە دەتوانرێت لەدوورەوە کۆنترۆڵبکرێت بۆ ئەوەی لە ئایندەیەکی نزیکدا پزیشکان بەکاریبهێنن بۆ لەناوبردنی خانە شێرپەنجەییەکان.پسپۆڕان هیواخوازن بەمنزیکانە ئەو تەکنیکە نوێیە بەکاربهێنرێت کە لەڕێگەی دەرزییەوە دەدرێت لە نەخۆشانی شێرپەنجە بۆ گواستنەوەی ئەو ماددانەی خانە شێرپەنجەییە زۆربووەکان لەناودەبەن.



پسپۆڕان دەڵێن: ئەو ڕۆبۆتە تازەیە بریتییە لەخانەی زۆر بچوك كە لە قەوزە دروستكراوەو زیاتر لە تەواوكارە خۆراكییەكاندا بەكاردەهێنرێت، هەروەها جەختیان لەوەش كردەوە كە ئەو قەوزەیە لە سەردەمی شارستانییەتی ئەزتیكیشدا كە ئێستا وڵاتی مەكسیكە وەك سەرچاوەی خۆراك بەكارهاتووە، ئەو قەوزەیە دواتر بە شێوەیەكی بیۆلۆژی شیدەبێتەوە، ئەمەش چەمكێكی نوێ دەداتە بواری پزیشكی و دەبێتە ساتێكی جیاكەرەوە لە ڕوبەڕووبوونەوەی نەخۆشی شێرپەنجەدا.

پسپۆڕانی هەردوو زانكۆی (هۆنگ مۆنگ) و (مانشستەر) ڕونیانكردەوە ئەو ڕۆبۆتە نانۆیە بەیارمەتی كایەی موگناتیسی كاردەكات، بەشێوەیەك لە دوورەوە كۆنترۆڵدەكرێت و بەوردی بەناو شلە بایەلۆژییە ئاڵۆزەكاندا تێدەپەڕێت بۆ ئەوەی هێرش بكاتەسەر خانە شێرپەنجەییەكان.

پێگەی ڕۆژنامەی (THE SUN)ی بەریتانی ئاشكرایكرد، ئەو ڕۆبۆتە تێكەڵانە دەتوانن هەست بە گۆڕانكارییەكان بكەن كە دەگاتە لەشی مرۆڤ و نەخۆشییەكە لەساتی دەركەوتنی نیشانەكانییەوە دەستنیشان بكەن.

پرۆفیسۆر (لی چانگ) سەرپەرشتیاری توێژینەوەکە وتی: لەبری ئەوەی ڕۆبۆتێکی بچوك دروستبکەین کە بە وزە کاربکات لەگەڵ تەکنیکە ئاڵۆزەکانی تاقیگەدا، ئامانجێکمان بۆ خۆمان دانا کە خۆی لە پەرەپێدانی ماددەی هۆشمەنددا دەبینێتەوە بە پشتبەستن بە سروشت.

وتیشی: بە لەبەرچاوگرتنی پێکهاتەی کیمیایی جەوهەری ئەو مادده سروشتییە دەتوانرێت لەبواری پزیشکیدا سودی لێببینرێت.جێگەی ئاماژەیە، پسپۆڕان ئێستا کار لەسەر ئەوە دەکەن کە دڵنیابن لە شیبوونەوەی سروشتی ڕۆبۆتەکە دوای ئەوەی ئەرکەکەی بە سەرکەوتوویی بەجێدەهێنێت.

پێویستە بوترێت، شێرپەنجە یەکێکە لە هەرە کوشندەترین نەخۆشییەکان لە جیهانداو بەپێی داتایەکی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی پێشبینی دەکرێت لە بیست ساڵی داهاتوودا حاڵەتەکانی تووشبوون بە نەخۆشی شێرپەنجە بەڕێژەی (70%) زیاد بکات لە جیهاندا.

هەر ئەو ڕێکخراوە ئاماژەی بەوە داوە کە شێرپەنجە دووەمین هۆکارەکانی مردنە لە سەرانسەری جیهانداو بەتەنها لەساڵی 2015دا زیاتر لە (8.8) ملیۆن کەس بەهۆی ئەو نەخۆشییەوە گیانیان لەدەستداوەو لە جیهاندا لەهەر 6 کەسی مردوو یەکێکیان بەهۆی جۆرێك لە جۆرەکانی شێرپەنجەوە مردووە.

